

# چه مکی ماف


مامۆستای یاریده ده ر
که مال سه عدی مسته ا
کۆلیژی یاساو رامیاری

## پێشەکی:

بیرۆکەی ماف زۆر کۆنەو وەچەی ئەمڕۆ نی یە. بیروڕای یاسا ناسان و زانایان لەبارەی دیارکردنی ناوەڕۆکەکەیەوە جیاواز بووە[1]. لایەنگرانی تیۆری ی یاسای سروشتی وایان سەیر دەکرد کە نموونەیەکی باڵای چەسپاو هەمیشەیی یە کە بەگۆڕانی کات و شوێن ناگۆڕێ، وە ئەمەش واتای ئەوەیە کە ماف لەلایەن ئەم کەسانەوە لەڕووی ناوەڕۆکەکەیەوە یەك چەشنە[2]. هەرچەندە سەرەڕای ئەم تێڕوانینە هاوبەشە بۆ ماف، کەچی بیرۆکەی ماف چەند کاریگەرییەك کاریان تێ کرد، هەندێك لەو کاریگەرییانە فەلسەفی بوون و هەندێکی تریشیان کۆمەڵایەتی یان سیاسی وەیان ئاینی بوون. بۆیە دەبینین بیرۆکەی ماف مۆرکێکی فەلسەفی لەلایەن یۆنانیەکانەوە پێوە نووسا هەروەها مۆرکێکی یاسایی لەلایەن ڕۆمانەکانەوەو ئایینی ی لەلایەن پیاوانی ئایینی ی کەنیسەی کاثۆلۆکی وەدواجاریش مۆرکێکی سیاسی ی لەکاتی شۆڕشی فەرەنسی پێوە نووسا.[3]

ئەوەی شایەنی باسە، ئەو تێڕوانین و بۆچوونانەی سەرەوە سەبارەت بەبوونی ماف هەمووی لەلایەن لایەنگرانی یاسای سروشتی یەوە بوو، هەر لەهەمان کاتدا کۆمەڵێکی تر لەیاساناس و زانایان بەدی دەکەین کە هەر لەبنەڕەتەوە نەهی لەبوونی ماف

دەکەن و بەبیرۆکەیەکی چەوت و نەفسووناوی دادەنێن"[٤]، بەڵام ئێمە خۆمان لەناو کۆمەڵەیەکی تر لە یاساناس و زانایان دەبینینەوە کە هەوڵی کۆکردنەوەی جیاوکەکانی (مزایا) بیروبۆچوونی هەردوو کۆمەڵەکەی تر دەدەن. لەبەرئەوەی بیرۆکەی ماف لەلایەن ئەم سێ کۆمەڵەوە بۆتە مایەی کێشە و مل ملانێ بۆیە تیشک خستنەسەر ئەم بیرۆکەیە وادەخوازێ کە لە سێ باسدا قسەی لێوە بکەین.

## باسی یەکەم

## کۆمەڵەی نەهی کەران

سەرەرای بایەخ و رەسەنێتی و بڵاوبوونەوەی زاراوەی ماف لە ژیانی رۆژانەداو لە نێو یاسا کۆنەکاندا، هەندێك فەیلەسوف و یاسازان هەن نەهی لە بوونی بیرۆکەی ماف دەکەن و داوای بەکارنەهێنانی ئەم زاراوەیە دەکەن.

لە راستیدا، بیرۆکەی ماف لەلایەن ئەم کەسانەوە دووچاری شاڵاوێکی زۆر دژوار بوو"[٥] لەسەرووی هەمووشیانەوە یاسازانی فەرەنسی لیون دگی Leon Duguit وە هەروەها یاسازانی نەمساوی هانس کلسن Hans Kelsen و لایەنگرانی رێچکەی

(مذهب) سۆسیالیست دێن.

## بەشی یەکەم

# تیۆری ی لیۆن دگی(٦)

لیۆن دگی لەسەرووی ئەو کۆمەڵە یاساسازانانەوە دێت کە بیرۆکەی ماف رەت دەکەنەوە و نەهێی لە بوونی ی دەکەن، بەڵکو یەکێکە لە دژوارترین و توندڕۆترین بەرهەڵستکاری رێچکەی تاک پەروەری (المذهب الفردي)، ئەم یاسازانە وای بۆ دەچێ کە: «نابێ دان بە مافی سروشتی ی بە مرۆڤ لکاو دابنێین چونکە مرۆڤی تاک و تەنیا مەحاڵە مافی هەبێت چونکە لەناو کۆمەڵدا نەبێت دەرناکەوێ لە بەرئەوەی دوو رەگەزی ئایەتی (ایجابي) و نایەتی (سلبي) تیایە»(٧) وە «ئەو مافەی کە سینەی کە باسی لێوە دەکرێ لە تەسەوورێکی ئەفسووناوی زیاتر چیتر نیە».(٨)

ئەم تەسەوورە ئەفسووناوی یە دەگەڕێتەوە بۆ دواوەی سروشت (ماوراء الطبیعة)، بەشێوەیەک دروست بووە کە جیاوازە لە واقیع بۆیە لە جیهانی یاسادا شوێنی نیە.(٩)

ئەم یاسازانە، رەخنەیەکی زۆر تووندو تیژی لە بیرۆکەی ماف گرت. رەخنەگرتنەکەی لەو بیرۆکەوە دەست پێ کرد کە دەڵێ ماف بریتی یە لە توانایەکی ئارەزوویی (سلطة ارادیة). وە بەپێی ی ئەم دەستەواژەیە تەسەووری ماف ناکرێت مەگەر تەسەووری

ئارەزووی بەرزتر لە ئارەزووی خەڵکانی تر بکەین بەشێوەیەك کەخۆی بەسەر ئەم ئارەزووانەدا بسەپێنێ. دوابەدوای ئەمە دگی دەچێتە سەر مەسەلەیەکی تر ئەویش ئاشکراکردن و بەدیارخستنی دژیەکی ئەم چەمکەیە لەگەڵ تیۆری یەکەی لەبارەی یاسای دانراوەوە.

ئەم یاسازانە داوامان لێ دەکات کەئەم بیرۆکەیە لەمێشکی خۆمان فڕێ بدەینە دەرەوە لەبەرئەوەی ناتواندرێ دانی پێدا بنرێت. لەم بارەیەوە دەڵێ: «بیرۆکەی ماف مۆرکێکی ئەفسووناوی تەواوی هەیەو بەکردەوە دەبێتە هۆی کۆمەڵێك (**استحالاتی حەقیقی**)»[10] وە دەبێتە هۆی پۆلین کردنی ئارەزووەکان، کەئەمەش لەناخەوە کاردەکاتە سەر چۆنێتی ی پێك هاتنی ئارەزووی هەردوولا. ئارەزوویێك باڵایەو فەرمان دەکات، ئارەزوویێکیش نزمەو گوێ ڕایەڵە.

ئەمە وادەگەیەنێ کەماف سەرهەڵنادات مەگەر ئەوە بسەلمێنین کەئارەزووەکان پلە پلەن وەبەپێچەوانەوە دەبێ بڵێین ماف نی یە چونکەبەبێ ئەم پلە پلەیە سەرهەڵنادات.

دگی داوای بەکارهێنانی بیرۆکەی مەڵبەندی یاسای بەهەردوو چەشنیەوە بابەتی و کەسی کەلەلایەن کۆمەڵەوە پارێزراون لەجیاتی بیرۆکەی ماف دەکات.»[11]

وەبەپێ ی تیۆری ی دگی «یاسا ناتوانێ ماف ببەخشێ بەمرۆڤ

بەڵکو فەرمان یان نەهی کردنیان ئاراستە دەکات، وە بەبڕوی ئەم ڕێبازە فەرمانبەخشانە (القواعد الامرة) ئەوە دێتە ئاراوە کە هەندێ کەس پابەندبن بە هەندێ ئەرك یان نەکردنی هەندێك کردار وە بەم شێوەیە دەبینین کەسانێك هەن خۆیان لە مەڵبەندێك دەبیننەوە کە پابەندێتی ی کۆمەڵایەتی دەیانپارێزێ چونکە ئەم مەڵبەندانە لە یاساوە هاتوون.

کەچی ئەو مەڵبەندانە مافە کەسینەو دەسەڵاتی ئارەزوویی هیچ کەسێکی تیا نیە.«١٢»

کەواتە ماف نیە بەڵکو کۆمەڵێك مەڵبەندی یاسایی هەن و بیرۆکەی مافیش بیرۆکەیەکی ئەفسووناوی یەو زانستی نی یە بەڵام بیرۆکەی مەڵبەندی یاسایی واقعی یەو هەستی پێ دەکرێ.

## بەشی دووەم

# تیۆری ی کلسن«١٣»

هانس کلسن یەکێکە لەو یاسازانانەی کە دانی بە بیرۆکەی ماف نەناوەو ئەم بوونەی بیرۆکەی مافی ڕەت کردۆتەوە.«١٤»

تیۆری یەکەی لەسەر ئەو بنچینەیە دامەزراوە کە دەبێ هەر شتێك کە پەیوەندی بە اعتباراتی ڕامیاری و باوەڕو کۆمەڵایەتی و فەلسەفەوە هەبێت پێویستە لە چوارچێوەی توێژینەوەو شی کردنەوەو باس کردنی دیاردە یاسایی یەکان دوور بخرێنەوە.«١٥»

وەبەپێی تیئروانینی کلسن بنچینەی یاسایی خۆی تەنیا لەناو یاسای دانراو (القانون الوضعي) دەبینێتەوە، وە بەم پێ یە یاسا بریتی یە لە ئارەزووی دەوڵەت وەهەموو بنچینە یاساییەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا دەگەڕێتەوە بۆ پێوەرێکی بنچینەیی هاوبەش کە دەستوورە، وە ئەم یاسا دانراوەش کۆمەڵێک ئەرک دروست دەکات و ماف دروست ناکات، وەبەم پێ یە کلسن بوونی بیرۆکەی ماف ڕەت دەکاتەوەو مافیش لەلای ئەو هیچ جیاوازی یەکی لەگەڵ بنچینەیەك لە بنچینەکانی یاسای دانراو نیە.

بۆیە هەر بنچینەیەك لەم بنچینانە بریار لەسەر ئەرکێکی دیاری کراو دەدەن بەڵام بریار لەسەر مافێکی کەسینە نادەن"[160]" وە تیوری ی کلسن لەم بارەیەوە لەگەڵ تیوری یەکەی دگی یەك دەگرنەوە.

ئەوەی شایەنی باسە، ڕەخنەیەکی زۆر ئاراستەی هەردوو تیوری ی یەکە کرا بۆیە هیچ کامێکیان سەرکەوتوو نەبوون لە رووخاندنی بوونی بیرۆکەی ماف وە لە ڕەخنە هەرە دیارەکان کە ئاراستەی دگی کران:

١ـ دگی وای بۆ دەچێت کە مرۆڤ بەتەنیا هیچ مافێکی نەبووەو نابێت تەنیا ئەو مافەی لەناو کۆمەڵدا بۆ دەبێت.

یاسازانەکان ئەم بۆچوونەی دگی یان بە بۆچوونێکی هەڵەزانی

وه لهم بارهیهوه دهڵێن مرۆڤ خۆی له خۆیدا حهقیقهتێكی ماددی و واقعی یه، ههندێك لهمافهكان و كهسایهتی یه یاسایی یهكهی لهسروشته كهسایهتی یهكهی خۆی وهردهگرێت، لهوانه مافی ژیان و پاراستنی قهوارهی ماددی و مهعنهوی خۆی و هی تریش.

٢ـ دگی وای بۆ دهچێت، كهووتت ماف دوو پهیوهندی دێنه بهرچاو، یهكێكیان پهیوهندی ی شكۆیی (سمو) ئهوهی تریان كڕنۆش بردن (خضوع).

ههرچهنده ماف خۆی له خۆیدا پێویستی به شكۆمهندی ههندێك و كڕنۆش بردنی ههندێكی تر ناكات، بهڵكو بریتی یه له دهسهڵات بهسهرابوون (استئثار) له لایهن ههندێكهوه و ڕێزلێگرتن له لایهن ههندێكی ترهوه. بۆیه كۆمهڵێك ماف ههن تهسهوری بوونی لایهنێكی خۆ بهزلزان و لایهنێكی كڕنۆش بهری لێ ناكرێت وهكو مافه گشتی یهكان و ئازادی یه گشتی یهكان.

٣ـ ههروهها یاسازانهكان رهخنهی ئهوهیان له دگی گرت كه هێنانهكایهوهی زاراوهی مهڵبهندی یاسایی (المركز القانوني) له جیاتی ماف بۆچوونێكی ههڵهیه و لهسهر خهیاڵ بنیات نراوه. ههروهها ههمان رهخنهی سهرهوه ئاراستهی هانس كلسن كرا سهرهرای رهت كردنهوهی بۆچوونه تایبهتی یهكهی لهبارهی تهرجیح كردنی بیرۆكهی ئهرك لهسهر ماف ههروهكو ئهم یاسازانه وای بۆ دهچێت كه یاسا كۆمهڵێك ئهرك دهخاته ئهستۆی مرۆڤ

نه ك به خشينى كۆمه ڵێك ماف.

وه ئه م بۆچوونه ش هه روه كو بۆچوونه كانى دگى هه ڵه يه چونكه له گه ڵ واقعى ژيان ناگونجێت له به رئه وه ى كۆمه ڵێك ماف و ئه رك بۆ ئه نجامدانى چالاكى يه پێويستى يه كان هه ن و ناتوانين چاويان لێ بپۆشين.(١٧٠) ئه وه ى شايه نى باسه، دواى باس و لێكۆڵينه وه له هه ردوو تيۆرى ى يه كه ى دگى و كلسن و خستنه رووى ئه و ره خنانه ى كه ئاراسته يان كران، ده توانين بڵێين كه ئه م دوو ياسازانه و لايه نگرانيشيان نه يان توانى بيرۆكه ى ماف بڕوخێنن وه هه روه ها له گۆڕينى زاراوه ى ماف به مه ڵبه ندى ياسايى يان ئه رك سه ركه وتوو نه بوون.

## به ندى سێيه م

## ڕێچكه ى سۆسياليستى(١٨٠)

ڕێچكه ى سۆسياليستى به پێچه وانه ى ڕێچكه ى تاك په روه ره وه به چاوى تاكه كه سێكى بێ لايه ن و دووره په رێز له نێو كه سانى تر سه يرى مرۆڤ ناكات به ڵكو سه يرى مرۆڤ ده كات وه كو بونه وه رێكى كۆمه ڵايه تى ى به ستراوه به كه سانى ترو هاوكار له گه ڵيان له پێناوى وه ديهێنانى به رژه وه ندى ئه و كۆمه ڵه ى كه سه ر به ئه وه، وه به رژه وه ندى گشتى ى له پێشه وه ى به رژه وه ندى يه تايبه تى يه كان داده نێت، هه روه ها ئيبكارى بوونى

ئەو مافە سروشتی یانەی مرۆڤ دەکات کە لە پێش بوونی کۆمەڵدا هەبووبێ. کەواتە ڕێچکەی سۆسیالیستی ڕێگا بە یاسا دەدات تا ئەوپەڕی دەست لە کاروباری مرۆڤ وەربدات»[١٩] بە مەبەستی هێنانەدی دادی ی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی گشتی ی و ئاراستەکردنی چالاکی یەکانی مرۆڤ بەلای ئەم ئامانجانەوە.

بۆیە پێویستە یاسا ماف و ئەرکی گشت مرۆڤێک دیار بکات بە و ئیعتبارەی کە بنچینەی ژیانە لە ناو کۆمەڵدا. هەروەها ئەم ڕێچکەیە مەرجێکی بۆ موڵکداریی تاکەکەس (الملكية الفردية) داناوە کە دەبێت لە ڕاژەی یاسا گشتی یەکانی کۆمەڵ بێت. ئەوەی شایەنی باسە، ڕێچکە سۆسیالیستەکان لە پلەدا جیاوازن. تیایاندا هەیە زۆر موبالەغە دەکات لە هەڵوەشاندنەوەی موڵکداریتی ی تایبەتی لە پێناوی بەرژەوەندی کۆمەڵ، وە هەندێکی تریشیان هەن ڕێگایەکی مام ناوەندییان لە نێوان ڕێچکەی تاک پەروەری و ڕێچکەی سۆسیالیستی گرتۆتەبەر بەوەی کە بەرژەوەندی کۆمەڵی لە پلەی یەکەم داناوە لە هەمان کاتیشدا دان بە موڵکداریتی ی تایبەتی و ڕێزلێنان لە ئازادی تاکەکەس دادەنێت بە شێوەیەك قوربانی بە بەرژەوەندی تاکەکەس نادات مەگەر دژی بەرژەوەندی گشتی ی کۆمەڵ بێت و لەگەڵیدا نەگونجێت.»[٢٠]

## باسی دووەم

# کۆمەڵەی لایەنگران

زۆربەی ئەو یاسازان و فەیلەسوفانەی کە خۆیان لە قەرەی تیۆری ی ماف داوە لایەنگری ئەم رێچکەیەن. ئەم یاسازانانە تیایاندا هەیە کە پێناسەی مافی بە شێوەیەکی زۆر فراوان کردووە. وە تیاشیاندا هەیە کە کۆمەڵێک مەرجی دیاری کراوی بۆ داناوە بۆیە لە نێو ئەم کۆمەڵەیەدا چەندین لایەن پەیدابووە کە لە دوو بەستدا باسیان لێوە دەکەین.

## بەستی یەکەم

# رێچکەی تاك پەروەر[21]

رێچکەی تاك پەروەر رێچکەیەکی زۆر کۆنە و رۆمانەکان و هەندێکیش لەوانەی بەر لەوان کە لە کۆمەڵگای کۆندا هەبوونە باوەریان پێ ی هەبووە.

ئەم باوەرەش لە ئەنجامی زوڵم و زۆرداری دەسەڵاتداران و دەسەڵاتی بێ سنووری چینی دەسەڵاتدار پەیدابووە. هەروەها بیرۆکەی مافە سروشتییەکانی مرۆڤ لە بیرۆکەی فەیلەسوفەکانی سەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا پەمە بەستی ئازادکردنی مرۆڤ لە ستەم و زۆرداری و پاراستنی مافەکانی و زامن کردنی سوود وەرگرتن لەو مافانە گەشەی سەند.

هه روه ها ئه م بیرۆکه یه «واته بیرۆکه ی مافه سروشتی یه کانی مرۆڤ» له کاتی شۆرشی فه ره نسیدا گه یشته لووتکه و ئه وپه ری گه شه سه ندنه وه و فه لسه فه ی تاکه که سیش به پالپشتی تیۆری ی یاسای سروشتی که وته کار پێ کردنه وه و وه گه رکه وتن.

ئه وه ی شایانی باسه، تیۆری ی مافه سروشتی یه کان ئه و تیۆری یه یه که ده لیّ هه ندێك نموونه ی بالا هه ن به گۆرینی کات و سات وه یان شوێن له لایه نی ناوه رۆکه وه ناگۆردرێن سه ره رای گۆرانی ناوه رۆکه کانیان به تێپه ربوونی کات به کارلێکردنی هۆکاره جیاکان.

وه ئه م بیرۆکه یه ش به درێژایی سه ده کان چه ند مۆرکێکی به خۆیه وه بینی له وانه مۆرکی فه لسه فی له سه رده می یۆنانیه کاندا [٢٢]، مۆرکی یاسایی له سه رده می رۆمانه کاندا [٢٣]، مۆرکی ئایینی له سه رده می ده سه لاتی که نیسه ی کاسۆلیك دا [٢٤]، هه روه ها مۆرکی رامیاری له سه ده کانی حه ڤده و هه ژده هه مدا [٢٥].

وه به پێ ی ئه م رێچکه یه مرۆڤ هه ندێك مافی هه ن که له سروشته وه وه ریان ده گرێت به و سیفه ته ی که مرۆڤه و پێ یه وه به نده و ناتوانێت لێ یان جیابێته وه و ئه و مافانه ش له بوونیاندا ئیستناد له سه ر بوونی یاساو ده وله ت ناکه ن به لکو ئیستناد له سه ر بوونی مرۆڤه که خۆی ده که ن. پشت نابه ستن به بوونی یاساو ده وله تی به لکو پێش به بوونی مرۆڤه که خۆی ده به ستن.

بەم پێی یە مرۆڤ مەبەستێکی سەرەکی یە لە هەموو ڕێکخستنێکی یاسایی‌داو بەر لە کۆمەڵیش کەڵک لەم مافانە وەردەگرێت. بۆیە فەرمانی یاسا هێنانە کایەوەی ماف نیە بەڵکو پاراستن و رەخساندنی بارێکی گونجاوە بۆ مرۆڤ کە بتوانێ لە سایەیدا کەڵک لەو مافانە وەربگرێت[٢٦].

## بەستی دووەم

## بیروڕای یاساناسانی ڕۆژئاوا لە بارەی بیرۆکەی مافەوە

دەتوانین پێناسینی ماف لەلایەن ئەم یاسازانانەوە بگەڕێنینەوە بۆ سێ بیروڕای جیاواز کە ئەمانەن:

### لقی یەکەم

### بیروڕای کەسی «الاتجاه الشخصي»

یاسازانی ئەڵمانی سافینی لە سەرووی ئەو یاسازانانەوە دێت کە ئەم بیروڕایەیان هەیە، لایەنگرانی ئەم بیروڕایە لە میانی خاوەن مافەکەوە سەیری ماف دەکەن، وە پێناسەی ماف بەوە دەکەن کە دەسەڵاتێکی ئارەزوومەندی یە یاسا لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا بە کەسێکی دەدات[٢٧]، وە ئەم توانا ئارەزوویی یەش لە ڕێچکەی تاک پەروەرەوە (المذهب الفردي)

هەڵقوڵاوەو سەری هەڵداوەو بەشێوەیەکی پتەو بەبنەمای دەسەڵاتی ئارەزوو (سلطان الارادة) بەستراوەتەوە، ئەو دەسەڵاتەی رێگا بە خاوەنەکەی دەدات ماف بنیات بنێت هەروەها بیانگۆرێت یان کۆتاییان پێ بهێنێت.

رەخنەی ئەوە لەم بیرورایە گیرا کە مافی بە ئارەزووەوە بەستاوەتەوە، وەهەروەها ئەم کەسانە ماف و بەکارهێنانی مافیان تێکەڵ بەیەك کردووە کە ئەمەش شتێکی چەوتە، چونکە ئەگەر ئێمە دان بەم بیرورایە بنێین ئەوا مەحاڵە کەسی دەسکرد (الشخص المعنوي) خاوەن ماف بێت، لە کاتێکدا کەسی سروشتی (الشخص الطبيعي) بەبێ ئەوەی توانای ئارەزوو کردنی هەبێت یان ئاگای لێ بێت کۆمەڵێك مافی دەبێت وەکو ئەو کەسانەی کەشێتن وە یان ئەو منداڵە بچووکانەی کەشت لێك جیاواز ناکەنەوە (الصغير غير المميز)«٢٨».

## لقی دووەم

## بیروڕای ناوەرۆکی (الاتجاه الموضوعي)

یاسازانی ئەڵمانی ئیهرنج لەسەرووی ئەم یاسازانانەوە دێت کەئەم بیرورایەیان هەیە، ئەم یاسازانە لە میانی ناوەرۆك و مەبەست لە بەکارهێنانی مافەوە سەیری ماف دەکات، بۆیە وای بۆ دەچێ کە ماف دوو رەگەزی هەبێت، رەگەزی مەبەست کە بریتی یە

لەو مەبەستەی ماف جێ بەجێ ی دەکات بۆ خاوەنەکەی، ئەویش باشەکەیە یان جیاووکێکە یان دەسکەوتێکە.

وەرەگەزێکی تر کە پارێزگاری ی یاسایی بە (**الحماية القانونية**) لەڕێگای دادگایی یەوە. وە لەسەر ئەم بنچینەیە پێناسەی ماف کراوە بەوەی بەرژەوەندی یەکە یاسا دەیپارێزێ.

ئەم تیوری یە سەرەرای پێ داگرتنی لەسەر بوونی ماف بە بێ لەوەی ئارەزوو و ئاگاداری ی خاوەنەکەی لەگەڵدا بێت کەچی لەرەخنە رزگاری نەبووە. لەبەرئەوەی نەیتوانیوە پێناسەیەکی تەواوی ماف بکات بەشێوەیەک کە پێناسەکە گشت رەگەزەکانی ماف بگرێتە خۆی و ئەو شتانەش کە پەیوەندی یان بە مافەوە نی یە دووریان بخاتەوەو رێگایان لەبەردەم بگرێت، وەهەروەها لەبەرئەوەی پێناسەی مافی بەناوەڕۆکەکەیەوە نەکردووە بەڵکو بەمەبەستەکەیەوە کردوە، هەروەها لەبەرئەوەی پاراستن پارێزگاری کردن لەدوای هاتنەکایەوەی مافەکەوە دەبێت نەک وەکو مەرجێک بۆ هاتنەکایەوەی بەڵکو مرکارێکە (**وسيلة**) بۆ پاراستنی ی[29].

## لقی سێ یەم

## بیروڕای تێکەڵاو (الاتجاه المختلط)[30]

لەبەرامبەر ئەو رەخنانەی کە ئاراستەی هەردوو کۆمەڵە بیروڕاکانی پێشوو کرا. کۆمەڵە بیرورایەکی تر پەیدابوو.

لایه نگرانی ئه م کۆمه ڵه یه بیروڕای هه ردوو کۆمه ڵه ی پێشوو ــ واته بیروڕای که سی و ناوه ڕۆکی ــ لێك ده به ستنه وه .

ئه وه ی شایانی باسه ، لایه نگرانی ئه و کۆمه ڵه یه له سه ر هه موو شتێ کۆکن ته نیا ئه وه نه بێت تۆزێك جیاوازییان له بیروبۆچوون له سه ر خستنه پێشه وه یان دواخستنی یه کێك له و دوو بیرۆکه یه له سه ر ئه وه ی تر هه یه .

هه ندێ له و یاسازانانه ، بیرۆکه ی ئاره زوو ده خاته پێشه وه و پێناسه ی ماف به وه ده کات : ( **توانایه کی ئاره زوومه ندی یه که به که سێك به خشراوه به مه به ستی ئه نجامدانی به رژه وه ندی یه ك که یاسا ده یپارێزێ** ). وه هه ندێکی تریشیان هه ن ، بیرۆکه ی به رژه وه ندی ده خه نه پێشه وه وه پێناسه ی ماف به وه ده که ن : ( **له و به رژه وه ندی یه یه که یاسا له رێگای دان پیانان به توانایه کی ئاره زوومه ندی دیاریکراو بۆ خاوه نه که ی ده یپارێزێ** ).

ئه وه ی شایانی باسه ، ره خنه ی ئه وه یان له بیروڕای ئه م کۆمه ڵه یه گرت ، گوایا کۆکردنه وه ی بیرۆکه ی ئاره زوومه ندی و به رژه وه ندی له یه ك پێناسه دا هیچ شتێکی نوێ له باره ی ناوه ڕۆکی مافه وه ناهێنێته کایه وه . بۆیه هه مان ره خنه ی پێشوو که ئاراسته ی هه ردوو کۆمه ڵه که ی تر کران ئاراسته ی ئه م کۆمه ڵه یه ش کرایه وه .

# باسی سێیەم

# بیروڕای نوێخواز (الاتجاه الحديث)

لەبەرامبەر ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی کۆمەڵەکانی پێشوو کراو لەبەر ئەوەی نەیانتوانی پێناسەیەکی تەواو بۆ ماف بدۆزنەوە کەگشت ڕوانگەکانی بەدیار بخات بۆیە لەنێو یاسازانانی نوێخوازدا هەندێك بیروبۆچوونی تر لەبارەی پێناسەکردنی مافەوە پەیدابوو.

بەڵام ئێمە لەنێوانیاندا تەنیا بیروبۆچوونەکانی زانای بەلجیکی جان دابان و یاسازانانی ئیسلامی هاوچەرخ دەخەینە ڕوو، لەگەڵ بەراورد کردنی ئەم یاسازانییە (فقه) لەگەڵ هەردوو ڕێچکەی تاك پەروەر و سۆسیالیستدا.

## بەشی یەکەم

## تیۆری جان دابان

یاسازانی بەلجیکی جان دابان لەتیۆرییەکەیدا لەبارەی ماف وای بۆ دەچێت کە ماف دەست بەسەراگرتن (الاستئثار) و دەسەڵات بەسەرابوونە (التسلط) بەسەر ماڵێك یان بەهایەکی دیاریکراو کە یاسا بەکەسێکی دەبەخشێ و دەشی پارێزێ، واتە دەست گرتنی

یەکێك بەسەر ماڵاتێکدا یان بەسەر بەهایەکدا بە شێوەیەك کە بۆی هەبێ پێی ئەم ماڵاتە یان بەهایە هی منە.

ماف بەپێی تێروانینی داپان لە چوار رەگەز پێك دێت: دوو رەگەزی یان ناوخۆیین کە بریتینە لە دەست بەسەراگرتن و دەسەلاَت بەسەرابوون وە بەهۆیانەیە خاوەن مافەکە دەستی بەسەر دارایی یەکی دیاری کراو یان بەهایەکی دیاری کراودا دەروا، وە هەروەها توانای دەست لێدانی ئەو دارایی و بەهایەی دەبێت، هەروەها دوو رەگەزی دەرەکی کە ئەوانیش بریتین لە بوونی هەندێ کەس و رێزلێنانی ئەو کەسانە لە ماف سەرەرای پارێزگاری ی یاسایی.

ئەوەی شایانی باسە، بەهۆی ئەم دوو رەگەزەی دوایی هەموو کەسێك پابەندی رێزلێنانی دەست بەسەراگرتن و دەسەلاَت بەسەرابوونی خاوەن مافەکە بەسەر ماڵات و بەهاکە دەبێ وە هەروەها یاساش کەفالەتی پاراستنی ئەم مافانە دەکات.

## بەشی دووەم

## بیرۆکەی ماف لە یاسازانی ی ئیسلامی

ئایینی ئیسلام دانی بە بیرۆکەی ماف ناوە وە لە نێوان ئەو مافانەدا مافی مرۆڤ دێت بەلاَم کەلێنێك کۆتی لەبەردەم داناوە تاوەکو دەستی مرۆڤ بگرێت لە بەکارهێنانی خراپ و لە وتاندنی ئەو مافانە بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی گشتی ی کۆمەڵ،

ئەمەش لە رێگای قەدەغەکردنی زیان گەیاندنە بەکەسانی تر لەلایەن لەوتێنەری مافەوە، وە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەهێنانەدی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ وەکو تاکەکەس و وەکو کۆمەڵیش مەبەستی سەرەکی ئایینی ئیسلامە، بۆیە لەئایینی ئیسلامدا دان نان بەماف شتێکی زۆر ئاساییە بەڵام ئەو کۆت و زنجیرانەی کەلەبەردەمی خاوەنەکەی دانراوە تەنیا هەر بۆ ئەوەیە کەهاوسەنگی ی نێوان بەرژەوەندی تاکەکەس و بەرژەوەندی کۆمەڵ پارێزراوبێ.

وەلێرەدا دەبینین کەچۆن ماف لەئایینی ئیسلامدا بەبەرگێکی تر خۆی دەنوێنێ و شێوەیەکی مامناوەندی وەرگرتووە لەمابەینی هەردوو رێچکەی تاك پەروەرو رێچکەی کۆمەڵ پەروەریدا.

مافی یەکسانی لەبەردەم یاسا لەگشت بوارە جیاجیاکانی ژیانی کۆمەلأیەتی لەمافە هەرە گرینگەکانە کەئایینی ئیسلام دانی پیاداناوە. هەروەها مافی ئازادی بیروڕاو مافی بیروباوەڕ.

هەروەها مافی خوێندن و فێرکردن، وەمافی دەست بەکاربوون لەفەرمانە گشتی یەکان و بەشداربوون لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا، وەمافی شوفعە.

وەلەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی خاوەنی هەموو شتێکە بۆیە دامەزرێنەری ماف و بەخشکەریشی هەر خوای گەورەیە. بەڵام خوا مرۆڤی لەسەر زەوی بۆ بەکارهێنانی ئەو مافانە کردۆتە

خه لیفه ی خۆی و رێگای پێ داوه سوودیان لێ وه ربگرێت. وه لێره دا بۆمان ده رده که وێ که ماف له ئایینی ئیسلامدا به خشینێکه (منحة) به کۆمه ڵێك مه رجه وه بۆ هێنانه دی ئه و به رژه وه ندی یه ی که له پێناویدا مافه که دروست بووه وه سه رچاوه ی ئه و به خشینه ش دان پیانانی خوای گه وره یه نه ك رواڵه تێکی سروشتی ی هه روه کو چۆن لایه نگرانی رێچکه ی تاك په روه ر وای داده نێن. بۆیه له ئایینی ئیسلامدا شتێك نی یه ناوی مافی که سی ی ره ها (حق ذاتي مطلق) بێت.

## به ستی سی یه م

## به راوورد کردنی بیرۆکه ی ماف له ئیسلامدا له گه ڵ هه ردوو رێچکه ی تاك په روه رو سۆسیالیستی

یاسازانی ی ئیسلام (الفقه الاسلامي) مافی به ده سه لاتێکی رێگا پێدراو بۆ که سێك داناوه که به هۆیه وه ئه و که سه ده توانێ به رژه وه ندی یه کی دان پیانراو بۆ خۆی وه ده ست بهێنێ به پێچه وانه ی رێچکه ی تاك په روه ر که وای ده بینی مرۆڤ له یه که م چرکه ی له دایك بوونیدا کۆمه ڵێك مافی هه یه وه ئه م مافانه ی له سروشته وه ده ست ده که وێ به و سیفه ته ی که مرۆڤه. «٣١»

له راستیدا، هیچ ناکۆکی یه ك له نێوان یاسازانی ی ئیسلامی و رێچکه ی تاك په روه ریدا سه باره ت به پیرۆزی ی ماف نییه.

هه‌روه‌ها سه‌باره‌ت به‌ مافی خاوه‌نه‌که‌ی بۆ سوود وه‌رگرتن له‌و مافه‌ به‌گشت رێگا جیاجیا ره‌واکان بۆ هێنانه‌دی به‌رژه‌وه‌ندی خۆی و به‌رژه‌وه‌ندی کۆمه‌ڵ.

به‌لام قه‌باره‌ی ئه‌و ده‌سه‌لاته‌ی که‌خاوه‌ن موڵك له‌یاسازانی ی ئیسلامدا هه‌یه‌تی وه‌کو رێچکه‌ی تاك په‌روه‌ر ره‌ها نییه‌، به‌ڵکو پابه‌ندی کۆمه‌ڵێك کۆته‌، هه‌روه‌کو ئه‌و کۆته‌ی له‌وتاندنی ماف (التعسف في استعمال الحق) و زیان گه‌یاندن به‌لایه‌نه‌کانی تر قه‌ده‌غه‌ ده‌کات.

له‌کۆتاییدا، له‌به‌ر رۆشنایی ئه‌م به‌راوورد کردنه‌ ساکاره‌دا ده‌توانین بڵێین که‌یاسازانی ی ئیسلامی شوێنێکی مام‌ناوه‌ندی وه‌رگرتووه‌ له‌نێوان رێچکه‌ی تاك په‌روه‌ری و رێچکه‌ی سۆسیالیستیدا.

له‌ئه‌نجامی خستنه‌روو و لێکۆڵینه‌وه‌ی ئه‌و تیۆری یانه‌ی که‌باسیان له‌بیرۆکه‌ی ماف و پێناسه‌ی ماف کردووه‌، بۆمان ده‌رده‌که‌وێ که‌تاوه‌کو ئێستا پێناسه‌یه‌کی دیاری کراو بۆ ماف دانه‌نراوه‌. وه‌هۆی ئه‌مه‌ش بۆ ئه‌وه‌ ده‌گه‌رێته‌وه‌ که‌هه‌ر کۆمه‌ڵێك له‌و کۆمه‌لانه‌ له‌گۆشه‌یه‌کی دیاری کراو ده‌روانێته‌ ماف، هه‌روه‌ها دوای ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه‌ ده‌توانین بڵێین پێناسه‌کردنی ماف به‌شێوه‌یه‌ك که‌گشت ره‌گه‌زه‌کانی بگرێته‌وه‌ و تایبه‌ت بێت پێ ی شتێکی ئاسان نی یه‌.

# ڕایەڵو
# جۆرەکانی ماف

ئەگەر بێتو سەرنجێکی بیروڕای یاسازانان بدەین سەبارەت بە بیرۆکەی ماف هەروەها لەو تیوری‌یانە وورد بینەوە کە سەبارەت بەم بیرۆکەیە هاتۆتەکایەوە بەتایبەتی تیوری‌یەکەی یاسازانی بەلجیکی جان دابان بۆمان بەدەردەکەوێ کەماف دەست بەسەردا ڕۆیشتن‌و دەسەڵات بەسەردا بوونێکە بەسەر دارایی‌یەکی دیاری کراوەدا. وەهیچ دەسەڵات بەسەردا بوونێك بەسەرداریەك بوونی کەسێك کە بەم دەسەڵات بەسەردابوونە هەستێ تەسەوور ناکرێت. هەروەها لەبەرامبەر ئەمانیش کەسێك وەیان کەسانێك هەن ڕێزگرتن لەم دەست بەسەرا ڕۆیشتن‌و دەسەڵات بەسەر دابوونە ئەرکی سەرشانیان لەگەڵ هەڵنەستان بەدەست درێژی کردن بۆ سەریان.

لەم شیکردنەوەیەدابۆمان دەردەکەوێ کە کەس (الشخص) یەکەم ڕایەڵە لە ڕایەڵەکانی ماف، هەروەها دەست بەسەر ڕۆیشتن‌و دەسەڵات بەسەردابوون ئەوە دەگەیەنێ کە شتێك یان بەهایەك هەیە دەستی بەسەر داگیراوە، ئەوشتە یان ئەو بەهایە ناوەرۆکی (محل) مافەکەیە یان

بابەتەکەیەتی کەواتە ناوەرۆکی ماف (محل الحق) دووەم رایەڵی مافە.
هەروەها دەست بەسەرا رۆیشتن و دەسەڵات بەسەردا بوون بەسەر دارایی یەکی دیاری کراو هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نابێ ئەگەر هاتوو لەلایەن کەسانی ترەوە دەست درێژی کرایەسەر لەکاتێکدا ئەگەر یاسایەك نەبێ سزای دەست درێژی کەران بدات و بیان تۆقێنێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ماف پێویستی بەیاسایەك هەیە کە بیپارێزێ کەواتە پارێزگاری یاسایی رایەڵی سێیەمیەتی.
شایەنی باسە، یاسازانان سەبارەت بە دیارکردنی رایەڵەکانی ماف بیروڕایان لێك جیاوازە هەندێکیان دەڵێن ماف سێ رایەڵی (رکن) هەیە خاوەن ماف، ناوەرۆکی ماف، هەروەها پارێزگاری یاسایی. لەو یاسازانانە پرۆفیسۆر دکتۆر سەعدی بەرزنجی و دکتۆر عبدالله مصطفى دکتۆر و تۆفیق حسن فرج.
وەهەندێکی تریش هەن وای بۆ دەچن کەسێ رایەڵەکەی ماف بریتین لە خاوەن ماف و ناوەرۆکی مافەکەو ئامانجی ماف لەم یاسازانانەش شمس الدین الوکیل.
بەهەر حاڵ، ئێمە بیروڕای گرووپی یەکەم سەبارەت بە دانانی پارێزگاری یاسایی (الحمایە القانونیە) بە سێیەم رایەڵی ماف بە پەسند دەزانین چونکە ماف هیچ بەهایەکی نابێ ئەگەر یاسایەك کەفالەتی پاراستنی نەکات. وە بەمافێکی ناتەواو دادەندرێت و رەگەزی

بەرپرسیارێتی ی ناتەواو دەبێت.

**جۆرەکانی ماف:**

لەبەر زۆری جۆرەکانی ماف و جیاوازیان لەیەکتر بەهۆی جیاوازی تێروانینی یاسازانان بۆی، ناچار بوون دابەشی بکەن بۆ چەند جۆرێك بەپێی ئەو خاسیەتانەی لەهەر کۆمەڵەیەکیاندا هەیە.

هەندێك لەو یاسازانانە مافیان دابەش کرد بۆ مافە رامیاری یەکان و مافە نارامیاری یەکان یان مافە شارستانی یەکان. لەو یاسازانانە دکتۆر توفیق حسن فرج و دکتۆر محمد یحیی مطرو دکتۆر محمود محمد الوتری.

مافە رامیاریەکان بەو مافانە دەووترێ کە لەرێگای دەستوورەوە بۆ هەر تاکە کەسێك بڕیاری لەسەر دەدرێت بەو سیفەتەی کە هاوولاتی یەو ئەندامی دەوڵەتێکی دیاری کراو یان کۆمەڵەیەکی رامیاری یە بۆ ئەوەی بتوانێ لە رێگایەوە بەشداری کاروبارەکانی حوکم رانێتی ی و رێکخستنی بەرژەوەندی یە رامیاری وولاتەکەی بکات وەئەم مافانەش لەخزمەتی پاراستنی بەرژەوەندی یە رامیاری یەکان کۆمەڵ دانە وەك مافی هەڵبژاردن و مافی خۆپالاوتن بۆ ئەندامیتی ئەنجومەنی یاسادانان و شارەوانی و مافی دامەزران لە فەرمانە گشتی یەکان بەلام مافە شارستانی یەکان هەموو مافەکانی تر دەگرێتەوە تەنیا ئەو مافانە نەبێت کەبۆ تاکە کەس بڕیاری لەسەر دەدرێت بەو سیفەتەی کە ئەندامی کۆمەڵەیەکی رامیاریە [illegible] [illegible] ئەم مافە بۆ تاکە کەس بڕیاری لەسەر دەدرێت.

بەسیفەتی ئەوەی کەئەندامی کۆمەڵەو ئەومافانەش بەمەبەستی پرۆسەکردنی چالاکی یە ئاسایی یەکانی لەناو کۆمەڵدا بڕیاری بۆ لەسەر دراوە لەو مافانەش ماف و ئازادی یە گشتی یەکان وەك مافی کەس لەژیاندا وەیان مافی لەسەلامەتی لەش و ئەندامەکانی هەروەها مافی لەپاراستنی ئەوارە ئەدەبی یەکەی وەك سومعەو شەرەف هەروەها ئازادی یە کەسی یەکانیش دەگرێتەوە.

هەروەها ماف و ئازادی یە تایبەتی یەکانیش دەگرێتەوە لەوانە مافی خێزان وەك مافی باوك لەسەر منداڵەکانی وەمافی منداڵەکان لەسەر باوکیان وەمافی مێرد لەسەر ژنەکەی وەمافی ژنیش لەسەر مێردەکەی وەهەروەها وەك مافە راستیەکان (حقوق عينية)ومافە کەسینەکان (حقوق شخصية) ومافە زەینی یەکان.

کۆمەڵەیەکی تری یاسازانان ماف دابەش دەکەن بۆ دووجۆر، مافە دارایی یەکانPecuniares Oupatrinoniaux ومافە نادارایەکان Extra_ Patirmoniaux droits لەو یاسازانانە دکتۆر حسن کیرە.

بەپێی بیرورای ئەوانە مافە دارایی یەکان بەهەموو ئەو مافانە دەوترێ کە تابعێکی دارایی هەبێت و مامەڵەی پێوە بکرێت.

بەلام مافە نادارایی یەکان بەو مافانە دەووترێ کە بەپارە ناخەمڵێندرێن و ناکرێت مامەڵەیان پێوە بکرێت.

هەروەها گروپێکی تری یاسازانان دابەش کردنی مافیان بۆ مافە دارایی یەکان ومافە نادارایی یەکان بە پەسەند زانیوە لەگەڵ

دەسکاری‌یەکی کەم ئەویش بە زیادکردنی جۆرێکی تری ماف لەنێوانیاندا بەناوی مافە زەینی‌یەکان.

ئەو ناوەشیان لەو مافە ناوە کە سروشتەکانیان لەسروشتی هەردووجۆرە مافەکە دەچێ چونکە لایەنێکی دارایی و لایەنێکی تری نادارایان تیایە بۆیە ناویان لەو مافانە ناوە مافە زەینی‌یەکان وەك مافی دانەر ومافی هونەرمەند بەسەر بەرهەمەکانیانەوەو مافی داهێنەر بەسەر داهێنانەکەیەوەو مافی بازرگان بەسەر ناوە بازرگانی‌یەکەی.

بۆیە بەپێی بیروڕای ئەم یاسازانانە ماف دەکرێ بەسێ بەشەوە، مافە دارایی‌یەکان و مافە نادارایی‌یەکان و مافە زەینی‌یەکان. لەو یاسا زانانە پرۆفسۆر دکتۆر سەعدی بەرزنجی و دکتۆر رمضان ابو السعود.

لەکۆتاییدا ئێمەش ئەم دابەش کردنەی دوایی‌یەمان بەلاوە پەسندە بەلام دوای گۆڕانکاری‌یەکی بچوك ئەویش بەگۆڕینی ناوی مافەزەینی‌یەکان بۆ مافەکانی ئەفراندنە ئەقڵی‌یەکان (حقوق الابتکارات العقلیە).

---

لەژمارە (١٠٦)ی رۆژنامەی هەرێمی کوردستان بلاوبۆتەوە.

# مافە نادارایی یەکان

شتێکی روون و ئاشکرایە مافە نادارایی یەکان بەو کۆمەڵە مافە دەووترێ کەبەپارە ناخەملێندرێ بۆیە مامەڵەی پێوە ناکرێت، ئەم کۆمەڵەیە مافە رامیاریەکان و مافە گشتی یە سەرەکی یەکان و ئازادی یە گشتی یە سەرەکی یەکان و مافی خێزان دەگرێتەوە.

مافە رامیاری یەکان بەو مافانە دەووترێ کەیاسا بۆ کەسێك لەووڵاتێکی دیاری کراو دانی پیادادەنێت بەو ئیعتبارەی کەئەندامی کۆمەڵەیەکی رامیاری یە تاوەکو بتوانێ پرۆسەی کاروبارەکانی حوکرانێتی ووڵاتەکەی بکات وەبەوە جیادەکرێتەوە کەفەرمانی رامیاری ی بەزۆرەکین و بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی یە بالآکانی کۆمەڵ بەکاردێن هەروەها تایبەتن بەهاووڵاتیان نەك بێگانە. هەروەها هەموو هاووڵاتیەکیش ئەو مافانەیان نابێت ئەگەر هەندێ مەرجی تایبەتی بۆ بەخشینیان لەئارادا نەبێت.

مافی هەڵبژاردن و مافی دەنگدان و مافی دامەزراندن لەفەرمانە گشتی یەکان دیارترین نموونەی مافە نادارایی یەکانن.

بەلآم مافە گشتی یەکان و ئازادی یە گشتی یەکان ئەو مافە سروشتی یانەن کەبۆ مرۆڤ دانیان پیادا دەنرێت لەبەرئەوەی مرۆڵە وەئەم مافانەش لکاون بەمرۆڵەوەو لەیەکەم چرکەی لەدایك بوونی یەوە دەی بێت و بەمردنیشی کۆتایان پێ دێت هەروەها هەموو مرۆڤێك

بەیەکسانی دەیانبینێت.

شایانی باسە، ئەم مافانە بەمافە گشتییەکان وەیان ئازادی بە گشتییەکان ناونراوە لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێك بەشێوەیەکی یەکسانی پێیان دەبەخشرێ. هەروەها بۆیە ناونراوە بەمافە کەسییەکان چونکە بریتییە لەکۆمەڵێك بەها کەبەهۆیانەوە مرۆڤ مقوماتی کەسایەتی خۆی دەسگیر دەبێت، وەبەمافی سروشتیو مافی مرۆڤ ناویان دەبردرێت چونکە مافێکن سروشتی مرۆڤایەتی فەرزیان دەکەنو یاسای سروشتی بۆ مرۆڤ بڕیاریان لەسەر دەدات بەحوکمی ئەوەی کەمرۆڤە.

لەراستیدا مێژووی سەرهەڵدانی ئەم مافانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم کاتێك هەندێك لەیاسازانە ئەوروپییەکان لەکاتی جەنگی خاچپەرستەکانی فەیلەسوفی بەناوبانگ ئەرستۆیان کۆڵیەوە بەمەبەستی گەڕان بەدوای یاسای سروشتی.

بەڵام مافی خێزان بەو مافە دەووترێ کەبۆ مرۆڤ دانی پیادا دەنرێ لەبەرئەوەی کەئەندامە لەخێزانداو سەرچاوەی ئەم مافانەش پەیوەندی خزمایەتییە وەلەنێو خۆیاندا جیاوازیان هەیە بەپێی جیاوازی مەرکەزو وەزعی کەسەکە لەنێو خێزانەکەدا.

# مافە داراییەکان

بۆیە ناو نراوە بەمافە داراییەکان، چونکە بەپارە دەخەمڵێندرێن، وەلەبەرئەوەی ناوەڕۆکی ئەم کۆمەڵە مافە دەخولێتەوە لەگەڵ بەهای

دارایی سوودی شتێك لەشتەكان یان كارێك یان نەكردنی كارێك. بۆیە ئیمە وای بەپێویست دەزانین كەبگەڕێینەوە بۆ یاسای شارستانی عیراقی ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١ سەبارەت بەماڵو شت لەگەڵ مەدلولەكانیان پێش ئەوەی بچینە سەر دابەشكردنی مافە داراییەكانو چوونە بنج و بنەوانی.

لەروانگەی یاسایی یەوە مەبەست لەماڵ (مال) هەموو مافێكە كەبەهایەكی دارایی هەبێ جا ئەو مافە هەر چ جۆرێك بێت وەناوەرۆكی هەرچی بێت واتە چ مافی راستینە بێت یان مافی كەسینە بێت وەیان مافی زەینی بێت هەروەكو لەدەقی ماددەی (٦٥)ی یاسای شارستانی ناوبراو ئەمەمان زۆر بەراشكاوی بۆ دیاردەكەوێ كەتیایدا هاتووە:

«ماڵ هەموو مافێكە كەبەهایەكی ماددی هەبێت».

بەلاّم شت بەناوەرۆكی ئەو مافە دەووترێ هەروەكو لەبڕگەی یەكی ماددەی (٦١)ی هەمان یاسادا هاتووەو دەڵێ:

«هەرشتێك بەهۆی سروشتەكەیەوە یان بەحوكمی یاسا لەمامەڵە پێ كردن دوور نەخسترێتەوە دەكرێ ببێتە ناوەرۆكی (محل) مافە داراییەكان».

لەم دوو ماددەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كەبیرۆكەی ماڵ تەنیا شتەكان ناگرێتەوە. بەڵكو ئەو مافانەش دەگرێتەوە كەدەكەونە سەر ئەو شتانەوەو خۆی لەخۆیدا بەماڵ دادەنرێن وەك مافی هاتورچۆ هەروەها ئەو مافانەش دەگرێتەوە كەناوەرۆكەكانیان شتێك نیە بەڵكو كردارێكە

یان نەکردنی کردارێکە.

هەروەها مافە مەعنەوی یەکانیش دەگرێتەوە وەك مافەکانی تەفراندنە ئەقڵی یەکان و مافەکانی پارێزگاری کردن لەقەوارەی ئەدەبی کەسایەتی.

# مافە زەینی یەکان

بەو مافانە دەوترێ کەدەکەونە سەر شتە نابەرجەستەکان و ناهەستیارەکان بەگوێرەی بیروڕای باو لەبارەیانەوە گوایا بەهەست دەرکیان پێ نابردرێت بەڵکو بەبیروهۆش هەستیان پێ دەکرێت. بەڵام ئەم بیروبۆچوونە رەهانیە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی تواناى هەستیارێتی ی لەلایەن مرۆڤەوە چونکە هەندێ کەس هەستی شەشەمیان هەیە کەبەئینگلیزی پێ ی دەوترێ Extra Sensory Perception واتە دەرکپێکردنی لەسەرووی هەستەوە.

بەهەر حاڵ، ئەم کۆمەڵە مافە، مافە زەینی یەکان دەگرێتەوە ئەو مافانەی کەدەکەونە سەر شتە مەعنەوی یەکان ی بەرهەمە ئەقڵی یەکان وەك داهێنانە ئەقڵی یەکان لەگشت بوارە جیاجیاکانی چالاکی یەکانی مێشکی مرۆیی کەپەیوەندی یان بەئەدەب و کاری هونەری و زانستی و هونەری شێوەکاری و وێنەگرتن و داهێنان و نیشانەی بازرگانی و نیشانەی خزمەتگوزاری و ناوی بازرگانی و هەموو مافێکی تر دەگرێتەوە کەمنبثق نین لەچالاکی فیکری لەبوارەکانی پیشەسازی زانست و ئەدەب و هونەر.

## په راويز :

١ـ د. منير محمود الوتري، القانون ط/٢ مطبعة الحافظ بغداد ١٩٩٠ ل١٣٩.
د. حسن كيره ـ المدخل الى القانون ـ منشأة المعارف بالاسكندرية ـ مطبعة اطلس ـ القاهرة ١٩٧٤ ل٤٢٣.

٢ـ د. منذر الشاوي ـ مذاهب القانون ـ له بلاوكراوه كانى كتيبخانه ى نيشتمانى ى ژماره (١)، دەزگاى الحكمة، بەغدا ١٩٩١ ل ٢٥.

٣ـ د. سعيد عبدالكريم مبارك ـ اصول القانون ـ ط/١ مطبعة التعليم العالي ـ مطبعة جامعة الموصل ١٩٨٢ ل٦٥ به دوا.

٤ـ د. عبدالحي الحجازي ـ المدخل لدراسة العلوم القانونيه ـ الحق ـ جامعة الكويت ١٩٧٠ ل١١، د. سمير عبدالسيد تناغو ـ النظرية العامة للقانون ـ منشأة المعارف بالاسنكدرية ـ ١٩٨٦ ل١٩.

٥ـ د. عبدالحي الحجازي ـ المدخل لدراسة العلوم القانونية ـ هه مان سه رچاوه ى پيشوو ل١١.

٦ـ ليون دگى Leon Duguit (١٨٥٩ـ١٩٢٨) به ناوبانگترين فه يله سووفى ياسايه كه فه ره نسا ناسيبيتى. پوخته ى تيوريه كه ى به ناوى : چه ند وانه يه ك له ياساى گشتى ى، له ناو كتيبه بچكولانه كه ى ده بينينه وه.

٧ـ ليون دگى ـ دروس في القانون العام ـ وه رگيرانى بۆ عه ره بى د. رشدى خالد. وزارة العدل ـ مطبعة وزارة العدل ـ ط/١ بغداد ١٩٨١ ل١٨.

٨ـ سه يرى ليون دگى بكه ـ هه مان سه رچاوه ى پيشوو ل٢١.

٩ـ د. محمد حسام محمود لطفى ـ موجز النظرية العامة للحق ـ القاهرة ١٩٨٨ ل٧.

١٠ـ ليون دگى ـ هه مان سه رچاوه ى پيشوو ل٢٦.

١١ـ ليون دگى ـ هه مان سه رچاوه ى پيشوو ل ٢٤.

١٢ـ ليون دگى ـ هه مان سه رچاوه ى پيشوو ل ٢٩.

١٣ـ هانس كلسن Hans Kelsen (١٨٨١ـ١٩٧٣). له شارى براغ له دايك بووه. له زانكوى ڤيه نا خويندوويه تى و له سالى ١٩١٧ تيايدا به ناونيشانى ماموستاى ياساى گشتى و فه لسه فه ى ياسا دامه زراوه. كلسن گه ليك كتيب و نووسينى

له باره ی تیوری ی ده وله ت و فه لسه فه ی یاسای نێوده وله تی به چاپ گه یاندووه .

١٤ــ له م باره یه وه بروانه :

Gabriel Marty et Pierre Raynaud, Droit Civil- Introduction Generale a L'etude du Droit 2 editon (C) Editions sirey - 1972 P.36.

١٥ــ د. رمضان ابو السعود ــ الوسيط في شرح مقدمة القانون المدني ــ المدخل الى القانون وبخاصة المصري واللبناني ــ النظرية العامة للحق ــ دار الجامعية للطباعة والنشر ــ بيروت ل١٢.

١٦ــ د. رمضان ابو السعود ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل١٢.

١٧ــ د. رمضان ابو السعود ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل١٦.

١٨ــ د. جعفر الفضلي و د.منذر عبدالحسين الفضل ــ المدخل للعلوم القانونية ــ النظرية العامة للقانون ــ النظرية العامة للحق ــ ط/١ وزارة التعليم العالي ــ الموصل ١٩٨٧، ل١٣٧ به دوا ، د. سه عدی به رزنجی ــ تیوری ی گشتی یاسا ــ ج١ چ/١. له بلاوكراوه كانی نه مینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان، هه ولێر ١٩٨٩ ل١٠٣ به دوا.

١٩ــ د. سعيد عبدالكريم مبارك ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل٩٧.

٢٠ــ سه باره ت به م رایه بروانه دكتۆر سعيد عبدالكريم مبارك ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل١٠٣.

٢١ــ له م باره یه وه بروانه دكتۆر سه عدی به رزنجی ــ تیوری ی گشتی ی ماف ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل٩٥ به دوا .

٢٢ــ د. محمد شريف احمد ــ فكرة القانون الطبيعي عند المسلمين ــ دراسة مقارنة ــ دار الرشيد للنشر ــ مطبعة دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٨٠ ل١٠١ به دوا .

٢٣ــ د. منير محمود الوتري ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل٢١ــ٢٢.

٢٤ــ د. منذر الشاوي ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل٤٣.

٢٥ــ الاستاذ عبدالباقي البكري واخرون ــ المدخل لدراسة القانون ــ بغداد ١٩٨٧

ل١٦٧.

٣٦ــ د. سعيد عبدالكريم مبارك ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل٢٥٨.

٣٧ــ د. حسين النوري ــ دروس في القانون ــ الحق ــ الالتزام والعقود التجارية ــ ١٩٧٧ ل١١، و د. محمد احمد الكزني ــ نظرية الاستحقاق في الفقه الاسلامي والقانون المدني ــ له بلاوكراوه كانی نه ميندارێتی ی گشتی ی ئه وقاف و كاروباری ئايينی ل٧.

٢٨ــ به شێوه یه كی تايبه تی له م باره یه وه بروانه :

د. سه عدی به رزنجی ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل ١٤.

٢٩ــ د. سه عدی به رزنجی ــ هه مان سه رچاوه ی پێشوو ل١٧ــ١٨.

٣٠ــ ڤيراراو سالی ی هه ردوو ياسازانی ئيتالی و فه ره نسی لايه نگرانی ئه م كۆمه له يه ن . بروانه دكتۆر سه عدی به رزنجی ــ سه رچاوه ی پێشوو ل١٩.

٣١ــ د. مصطفى الزلمي واخرون ــ المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية ــ ط/١، من منشورات وزارة التعليم العالي/ بغداد ١٩٨٠ ل٢٧٨.

# THIS BOOKLET

*PRESENTS A STUDY OF THE CONCEPT OF LAW FROM A PHILOSOPHICAL ANGLE IN THE LIGHT OF JURISPRUDENTS AND PHILOSOPHERS.*

*WE HAVE CLASSIFIED THE ENTIRE VIEWPOINTS REGARDING THE PHILOSOPHICAL BASIC OF LAW INTO THREE TYPES:*

*THE DENYING VIEW REPRESENTED BY SOCIALISM, THE SUPPORTING VIEW REPRESENTED BY INDIVIDUALISM AND MODERNISM.*

*FINALLY, WE SHED LIGHT ON THE CONCEPT OF LAW IN CONTEMPORARY ISLAMIC JURISPRUDENCE WHICH WE COMPARE WITH SOCIALISM AND INDIVIDUALISM.*

*Kamal Sa:di Mustafa*

*ASSISTANT LECTURER IN CIVIL LAW*

*COLLEGE OF LAW AND POLITICS*

*SALAHADDIN UNIVERSITY*

*IRAQI KURDISTAN REGION*

# فكرة الحق

## عند انصار المذهب الفردي والمذهب الاشتراكي واتجاه الحديث

## ووجه المقارنة بين فكرة الحق في الفقه الاسلامي المعاصر وبين المذهبين الفردي والاشتراكي


تأليف

**كمال سعدي مصطفى**

مدرس القانون المدني المساعد

في كلية القانون والسياسة - جامعة صلاح الدين

جمهورية العراق - اقليم كوردستان



چاپی دووەم

١٩٩٨